# کۆتایی ڕێگا

## بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

## "هەموو سەرەتایەک، کۆتاییەکی هەیە"

## سڵاو بەڕیزان...

هەر لە منداڵییەوە و یەکەمجار کۆمپیوتەرم بینی، حەزێکی تایبەتیم بۆ کۆمپیوتەر بۆ دروست بوو، ئەوکات تەمەنم ١٢ ساڵان بوو، لە پۆلی یەکی سانەوی واتە پۆلی ٧ ئێستا بووم، کە لەخوێندنگە کۆمپیوتەرم بینی، ٣ کەس هەندێک جار ٤ و ٥ کەس و یەک کۆمپیوتەرمان لەبەردەستدا بوو، زۆری هاوڕێکانم حەزیان بۆ کۆمپیوتەر نەبوو، بۆیە ئەوەی لە کتێبی کۆمپیوتەردا هەبوو جێبەجێیان نەدەکرد و دەستیان دەکرد بە قسەکردن و گفتوگۆکردنی هەموو بابەتێک جگە لە کۆمپیوتەر، من بەشەکاتی خۆم و ئەوانیش ئەگەر ڕازیبونایە هی ئەوانیش کارم بەکۆمپیوتەر دەکرد، نەک بابەتی ناوکتێب بەڵکو هەرچی بهاتبایەتە بەردەستم کلیکم لەسەر دەکرد و تاقیم دەکردەوە، وە حەزم لە کتێب خوێندنەوەش زۆر بوو، کات بەوشێوەیە تێپەڕی، تا کۆمپیوتەری خۆمم کڕی، بەخت هاوڕێم بوو کە ئینتەرنێت گران بوو، بۆیە هەرشریتێک دەکەوتە بازاڕ دەمکڕی، کاتی خۆم لەسەر فێرکاری و تاقیکردنەوەی بەرنامەی ناو شریتی کۆلێکشنەکان بەسەر دەبرد، تاڕادەیەکی باش فێری کۆمپیوتەر بوم، دوتر کە ئینتەرنێتم کڕی ئەوەی پێی ئاشنا بووم یانەی"هاک بۆ کورد" بوو، تاڕادەیەک شارەزای بابەتەکانی نێو هەندێک بەشی هاک بۆ کورد بووم، و دواتر یانەکانی "نازگوڵ" و "کورد سۆلۆشن" و "هێز بۆ کورد" و "سیستەم بۆ کورد" و "پی.سی بۆ کورد" و "تیمی هاکەرانی کورد" و "یانەی کوردان"م ناسی، وە بەهۆی ئەو کارە ناشەریفانەی کە ئەندامی یانەکان بەرامبەر یەک، وە ئەندامی یەک یانەش بەرامبەر یەک دەیاننواند و دوای لەکار کەوتنی چەند یانەیەک و وە بیستنی ئەوەی کە "هاک بۆ کورد" پێشتر هاک کراوە، وە چەند کتێبێکی کەتەلۆگی ماڵپەڕە کوردی و جیهانییەکانم لابوو، کە بەشێکی ماڵپەڕەکان

لەکار کەوتبوون، تێگەشتم کە دەبێت بابەتە گرنگەکان کۆبکەمەوە و بیپارێزم لە لەناوچون، چونکە هەموو شتێک کە سەرەتای هەبوو کۆتایشی هەیە، بۆ ئەو مەبەستەش بەشی کتێبخانەی یانەی هاک بۆ کوردم هەڵبژارد کە گەورەترین وە کۆنترین یانەی کوردی بواری هاک و خۆپاراستن بوو، لەبەر گرنگی کتێب وە حەزم لە کتێب، لەماوەیەکی کەمدا هەموو کتێبەکانی هاک بۆ کوردم داگرت و ڕومکردە ناو یانەکانی تریش و دواتر ماڵپەڕەکان وەک "ماڵپەڕی یانی" و "ماڵپەڕی کاروان ئایتی"، ئەوە بوو کە تێگەشتنەکەم ڕاست دەرچوو، زۆرینەی یانەکان لەکارکەوتن وە "هاک بۆ کورد" کێشەی تێکەوت کۆمەڵێک ئەندامی لێهاتو و چالاکی بە تۆمەتی جنێودان و دانانی سێرڤەر دەرکران، بەوهۆیەوە یانە ناچالاک بوو، وە بەشی زۆری لینکی بابەتەکان لەکارکەوتن، وە من بیرم لەوە کردەوە، کە ئەو کتێبانەی لامە لە جێگایەک دایبنێم بۆ ئەوەی هەموان سودی لێ ببینن، بۆیە بلۆگەرێکم دانا بەناوی "کتێبخانەی کوردی" پاش چەند ناوگۆڕینێک ناوەکەیم کرد بە

"na0an"

وە هەموو کتێبەکانی هاک بۆ کورد و یانەکانی تر، وە کۆمەڵێک کتێبی ماڵپەڕەکانی وەک "تەنها کتێبەکان" و "پەرتووک" و "کتێبخانەی گشتی سلێمانی" و " منتدى إقرأ الثقافي" و "موکریانی"م کۆکردەوە هەندێکیم لە بلۆگەرەکەم دانا، ئەوەی کتێبی کۆمپیوتەربێت بەشی زۆریم داناوە، وە بەشێک لە کتێب لە بوارەکانی تردا، وە من بۆ ئەم جیلە کۆنم، بەڵام بۆ جیلی "نیۆ کۆی" و "ئەنگری بۆی" و "ئێس.ئێف.دی" و "ئەحمد کفری" و "سەعد هەولێری" و "بروسک٠٠٧" و "دلۆڤان ئایتی"....هتد نوێم، من هی سەردەمی کۆلێکشنی " پەلکە زێرینە ٥ و ٦ و ٧" هی ئەو سەردەمەی کە لەجیاتی فەیسبوک خەڵک یانەی "کورد کلیک" و "هاک بۆ کورد" یان بەکاردەهێنا، ئەوکاتەی کە "فۆرمات ئێکس فۆرمات" هاک بۆ کوردی هاک کرد، لەم پۆستە بەدواوە ماڵئاوای لە بلۆگەر دەکەم، نایەوێت هیچ بێتاقەتییەک بۆ بلۆگەرەکەمان بخۆن، نەک بلۆگەر بەڵکو بۆ منیش، ژیان ئاوایە، پێش ئێمە ژیان هەبووە، ئێستاش

ژیان بەردەوامە، دوای ئێمەش بەردەوام دەبێت، وە بەئێمە و بەبێ بونی ئێمە، ژیان هەر بەردەوام دەبێت، گرنگ ئەوەیە کە کەسێکی سودمەندبین بۆ کۆمەڵگە، وە تێبگەین تەنها بۆ ماوەیەکی کەم هاتوینەتە ئەم ژیانە تاقیکردنەوەیەک دەکەین و ئێرە بەجێ دەهێڵین، ئەوەی گرنگە کە ڕەزامەندی خودا بەدەست بهێنین.

انشاالله لە تێلیگرام لە کەناڵەکانی زانستی کۆمپیوتەر و کتێبخانەی نەیڤەن و ئاینی ئیسلام، بەردەوام دەبین، ئەگەر ڕۆژێک بلۆگەر بەهۆی کێشەی ناچالاک بونم سوتا ئەوا کتێبەکان لە ماڵپەڕی ئەرشیڤ ئینتەرنێت و تێلیگرام هەر دەمێنێت، وە ئەو کتێبانە ئەگەر خوێندتانەوە دەبێت لەوە تێبگەن هی ئەم کاتە نییە، بەڵکو بەپێی ساڵی بڵاوکردنەوەی کتێبەکە هەڵسەنگاندنی بۆ بکەن.

https://t.me/na0an_Group

https://t.me/cs_pdf

https://t.me/na0an

https://t.me/Ayne_islam

# 2019-09-21